



- وەک دەزانیت فەیلەسوفی ڕاستەقینە هەرگیز نابێت خۆی بدات بەدەستەوە. ئەگەر تەنها ئەم، ئا... ئا، ئا ئەم پەتەمان بکردایەتەوە...

هێشتام هەر ئەستێرەی تریش دێنە ئاسمانەوە... هیلدە گوتی.
- بەڵێ، ئێستاکە تاریکترین شەوی هاوینە.
- بەڵام لە زستاندا دەدرەوشێنەوە. شەوی پێش سەفەرەکەی لوبنانت لەیادە؟ یەکەمین شەوی ساڵی نوێ بوو.
- ئەو ڕۆژە بوو کە بڕیارمدا کتێبێکی فەلسەفیت بۆ بنووسم. پێشتر ڕۆیشتمە لای کتێب فرۆشەکانی لیللەساند، تەنانەت چوومە کتێبخانە گەورەکانیش، بەڵام هیچ کتێبێکی وام بەرچاو نەکەوت کە تایبەت بێت بە گەنجان.
- لەوە دەچێت لەسەر ترۆپکی تاڵێکی باریکی فەرووی کەروێشکەکەدا دانیشتبین.
- تۆ بڵێیت کەسێکی تر لەو گەردوونە گەورەیەدا هەبێت؟
- تەماشاکە، بەلەمەکە بەربوو!
- بەڵێ، بەڕاست...
- مەحاڵە، ئەمڕۆکە پێش ئەوەی تۆ بگەڕێیتەوە، خۆم چوومە خوارەوە و بەوردی تەماشام کرد بەسترابووەوە...
- بەڕاست؟
- ئەو کاتەم بیردەخاتەوە کە سۆفیا سواری بەلەمەکەی ئەلبێرتۆ بوو. لەیادتە بەلەمەکەی چۆن لە ناوەڕاستی دەریاچەدا جێما؟
- کێ دەڵێت ئەم جارەشیان هەر پەنگی سۆفیا نیە؟





- گاڵتەم پێدەکەیت، بەڵام بە درێژایی ئێوارەکەمان هەستم دەکرد کەسێکمان لەگەڵدایە.
- دەبێت یەکێکمان بە مەلە خۆی بگەیێنێتە بەلەمەکە.
- بابە، با هەردووکمان بەمەلە بۆی بچین.